زنجیره وتاری

# ( لـە تاریکاییەکانەوە بـەرەو ڕوناکی تەوحید )

## بەشی

## ١

وتاری مامۆستا

ابـو عبدالحمید کوردی

نو یسنی

پێگەی نهاوند




لـە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕوناکی

تەوحید

من كەسێكی گومڕا بووم لە تاریكایا ئەژیام لەناو كوفرو شیركا ئەژیام واشم ئەزانی لەسەر ڕێی حەقم من ئەو موسڵمانەم كە وا ئەچمە بەهەشتەوە كردەوەكانم كردەوەی كەسی باشە بەڵام لە دوای ئەوە الله تعالی بە فەزڵی خۆی هیدایەتی دام ئەو ڕێگا ڕاستەی بۆمانی ڕوون كردەوە و هیدایەتی داین لەسەر ئەم ئیسلامەی كە ئێمە لێی تێنەگەیشتبووین ئەو ئیسلامەی كە ئێمە زۆر دوور بووین لێی ئێمە لە لایەك بووین ئیسلامیش لە لایەك

كەسێک بووم وام ئەزانی ڕێگەی حەق ئەوەیە كە من ئێستا لە سەری ئەڕۆم بەڵام ئەوەی وای لێمان كرد كە گومڕا ببین بەداخەوە ئەوەش ئەوە بوو كە دوركەوتینەوە لە قورئان و حەدیس لە فەرموودەكانی رسول ألله(ﷺ) كاتێك كەوتینە دوای كەسانێك بەناوی دینەوە ئێمەیان هەڵخەڵەتاند ئەچووین دەرسمان لە لایان ئەخوێند كتێبەكانیانمان ئەخوێندەوە گوێمان لێیان ڕائەگرت كاتێك بەناو دینەوە قسەیان ئەكرد وامان ئەزانی هەر ئەمان حەقن و دەبێ لەسەر ئەوەی ئەوان ووتیان ئاوا بڕۆین بەڵام دوای ئەوە الله تعالی قەدەری وابوو كە هیدایەتمان بدات و ڕێگەی ڕاستمان بۆ ڕوون بكاتەوە لەبەر ئەوەی خۆی ئەفەرمووێت﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾ (النور: ٤٠) ئەو كەسەی الله تعالی ڕۆشنای پێ نەبەخشێت و نوری پێ نەبەخشێ نوری نییە ئەو كەسە لەسەر گومڕای ئەڕوات بۆیە ئەم زنجیرەیە ئەوەی وا پاڵی پێوەنام كە باسی بكەم و بیگێڕمەوە و ڕوونی بكەمەوە بۆ مرۆڤەكانی سەر زەوی بەگشتی ئەوەیە كەوا خۆم لەو گومڕایە ئەژیام بۆم دەركەوت دوای ئەوەی كە هیدایەتی دام الله تعالی بۆیە ئەزانم كە كەسانێكی زۆر هەیە ئێستا لەناو ئەو كەسانە ئەژین دێنە مزگەوت و غەیری ئەوانیش وا ئەزان لەسەر ئەو ئیسلامەن كەوا قورئان داوای كردووە لێیان بەڵام بەداخەوە كاتێك من ئەو قسانە ئەكەم قسەی ڕۆژێك و دووان و مانگێك نییە چەن ساڵ ئێمە هاتوو چۆی مزگەوت ئەكەین لەناو مزگەوتەكان چەنەها مامۆستا لەلای چەنەها مامۆستای جۆرا و جۆر چ لە لایەنەكان بێت چ لە حیزبەكان بێت چ لە بێلایەنەكان بێ دەرسمان خوێندووە شەو گارێكی زۆر ڕێمان بڕیوە چوینەتە ماڵیان چوینەتە مزگەوتەكان لەلایان دەرسمان خوێندووە بەس بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاست بدۆزینەوە و ڕێگە حەقەكە بدۆزینەوە بۆیە وامان ئەزانیی ئەوە حەقە ئێستاش كە سانێكی زۆر هەن كە بەدوای حەقا ئەگەڕێت ئەو پرسیارەی كەوا زۆربەی سەر زەوی زۆر بەی زۆری سەری سوڕماوە بەتایبەت ئەوانەی كە بە خۆیان ئەڵێن مسووڵمان كە ئەویش ئەوەیە ئەڵێ كۆمەڵ كۆمەڵ و جەماعەت جەماعەت زۆر بووە نازانین حەق لەلای

كێیە حەق بزر بووە ! ئەم قسەیە قسەیەكی زۆر هەڵەیە ئێستا ڕونی ئەكەینەوە بە بەڵگەی (قورئان و حەدیس) لەبەر ئەوەی ألله تعالی ئەفەرمووێت﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٨ ﴾ (الحدید:٢٨) ئەفەرمووێت ئەی ئەوانەی ئیمان دارن لە الله تعالی بترسن باوەڕ بە پێغەمبەرەكەی بێنن(علیه الصلاة والسلام). ئەگەر وابكەن دوو جار ڕەحمتان بەسەرا ئەڕژێنێت لەدوای ئەوەش ئەفەرمووێ(وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ) ڕۆشناییتان پێ ئەبەخشێ بەڕێوە بچن پێی بەو ڕۆشنای الصراط المستقیمەكەی كەوا ڕۆژانە لە نوێژەكانماندا ئەڵێین(ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ) ئەو (ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ)تان بۆ ڕون ئەكاتەوە و ئەتان خاتە سەری بەڵام شەرت ئەوەیە كە وا ئێوە لە الله تعالی بترسن پەیامەكەی چۆن بەڕاستی دای گرتوە ئاوا دەستی پێوە بگرن لەپاشاندا بەقسەی پێغەمبەرەكەی بكەن(ﷺ). بەڵام گەورەترین مشكیلەی ئەم سەر زەویە ئێستا كە وا مسووڵمانان و ئەوانەی بە ناوی ئیسلام كار ئەكەن ئەوەیە پشتیان كردووە لە قورئان پشتیان كردووە لە فەرموودە هەر چەندە ئەڵێین ئێمە لەسەر قورئان فەرموودەین بەڵام بەداخەوە پشتی لێ كراوە نەك لەسەری بڕۆین (ئەم زنجیرەیە تایبەت نییە بە كۆمەڵە كەسانێک بۆ هەموو مرۆڤەكانە بۆ گەنج و پیر بۆ ژن و پیاو بۆ كوڕ و كچ بۆ منداڵ و بۆ گەورە بۆیە كاتێک كە قسە ئەكەم بەڕاستی قسەكانم ئاراستەی هەموو جۆرەكان ئەكەم تایبەت نییە بە كەسانێكی دیاری كراو (ئەو پرسیارە گرینگەی كە وا زۆر كەس ئەمڕۆ وا هەست ئەكات وەڵامی نییە كە ئەویش ئەوەیە حەق لە كوێیە؟ كێ حەقە (عەلمانیەكان ئەڵێن ئێمە مسووڵمانین)(حیزبە ئیسلامیەكان ئەڵێن ئێمە حەقەكەین)(كەسانێك ئەڵێن ئێمە سەلەفین و لەسەر حەقی) كەسانێک ئەڵێن ئێمە سۆفین و لەسەر قورئان و سونەت ئەڕۆین)(كەسانێک ئەڵێن ئێمە بێ لایەنین و حەقمان نییە بەسەر هیچ حیزبێكەوە ئێمە لەسەر قورئان سونەت ئەڕۆین و ئێمە حەقین ) زۆر جار خەڵک ئەڵێ حەق بزر بووە ئێمەش یەكێك بووین لەو كەسانەی كە وامان ئەوت ئەمان ووت حەق بزر بووە نازانین ئەم حەقە لای كێ بدۆزینەوە؟!

ئەو قسەیە و ئەو پرسیارە زۆر هەڵەیەكی گەوریە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی خۆشەویستە (ﷺ) لەبەر ئەوەی حەق بزر نابێ ئێمە بزر بووین نموونەیەكی كورت جاری وا هەیە ئێمە لە شووێنێك لە ماڵەكەی خۆمانا شتێک دا ئەنێین بەجێی دێڵین بۆ ماوەیەک مەشغوڵێتی دونیا و پارەو ماڵ و منداڵ مەشغوڵمان ئەكات دوای بیر ئەكەینەوە ئەڵێین شتێكمان هەبوو دێن ئەگەڕێن و دوای نای دۆزینەوە چی ئەڵێین (ئەڵێن لە شوێنێک دام نا بەس بزرم

كردووە ئەگەڕێم بە دوایا نای دۆزمەوە ئایا ئەو شتەی كە دات نا شووێنكەی گۆڕا نەخێر هەر لە جێی خۆیەتی بەڵام تۆ و ئێمە لە مەشغولێتی دونیا و بیركردنەوە لە هەموو شتێک ئیلا لە و حەقە نەبێ وایان لێهان كرد كەشتەكانمان لێ برز بێت كە ڕێگەی حەقەكەمان لێ بزر بوو واتا شتەكە هەر لە شووێنی خۆیەتی ئەم دینە هەر وەک خۆی ماوە بەڵام ئێمە بزرمان كردووە مەڵێ حەق بزر بووە بڵێ من بزرم كردووە ئەو قسەیە ئاوایە نەک بەو شێوەی كە خەڵكی ئێستا باسی ئەكات وە بۆیە حەق بەردەوام ڕونە ، جونكە حەق ڕوناكی لەسەرە كە هەر كاتێک ئەی دۆزیتەوە هەستی پێ ئەكەیت بۆت دەر ئەكەوێت كە حەقە ئەمجا ئەزانی كاتی خۆی لە كوێ بوویت ئێستاش لە كوێ بووی بۆیە كاتێک كە شتەكە ئەدۆزیتەوە ئەڵێ ئەها لێرە دام نابوو بەس لە بیرم چوەوە ، بۆیە ئەو حەقەش بزر نەبووە بەس ئێمە بزرمان كردووە كاتێک مەشغوڵ بووین بەم دونیا هیچە كاتێک مەشغوڵ بووین بە هەموو شتێكەوە ئەوەی كە بیرمان لێ ئەكردەوە تەنها دونیا بوو ئەوەشی كە بیرمان لێ نائەكردەوە دین بوو كاتێک كە ئەم دینە پشتهان لێ كرد ، پەنا ئەگرین بە (الله تعالى) بۆیە با بە دوایدا بگەڕێینەوە ، پرسیارێك دروست ئەبێت لێرە ئایا ئێمە موسڵمانین ؟ ئێمە و تۆ ئەی ئەو كەسەی كە خوێنەری ئەم قسانەی موسڵمانین ؟ ئێمە موسڵمانین ؟ بێگومان ئەڵێیت بەڵێ زۆر كەسیش هەیە ئەڵێ بەڵێ ئێمە موسڵمانین و ئیماندارین و بڕوادارین . بەڵام پرسیارێك ؟ ئەگەر ئێمە وڵاتەكەمان و كۆمەڵگاكەمان كۆمەڵگایەكی موسڵمانە بە دڵ سەیری شتەكە بكە نەك بە ووتن

با بە دڵ گوێ لە شتەكان بگرین جونكە ئەوەی كە كوێر ئەبێ چاو نییە ئەوەی كە كوێر ئەبێ چاوی دڵە وەک الله تعالى ئەفەرمێت﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾(الحج: ٤٦)چاو كوێر نابێ ئەوەی كە كوێر ئەبێ ئەو دڵەیە كە چاوی هەیە كوێر بووە لەم سەردەمەدا زۆر كەس چاوی دڵی كوێر بوو ، چاوی بەسەر ئەبینێ بەڵام دڵی كوێر بووە بۆیە با بە دڵ لەگەڵ ئەم زنجیرە باسەیا بین با بە دڵ بژین لە گەڵیا تۆزێ كاتی بدەینێ لە كاتەكانمان پێوستە والله لەبەر ئەوەی كە باسەكە باسی بەهەشت و جەهەنمە باسی ئیمانە باسی كوفرە بۆیە ئینسان با بەرچاوی ڕوون بێ كاتێک لە ناو ئەم سەردەمەیا ئەژی ، ئایا ئێمە موسڵمانین ئەگەر ئێمە موسڵمانین سەیری تەلەفیزیۆنەكەت بكە بزانە ئەوەی لە تەلەفیزیۆنەكەت سەیری ئەكەیت خۆت وماڵەوەتان باسی ئیسلامەت و موسڵمانیەتیە سەیری دەوروبەری خۆت بكە لە خوشك و دایک و لەخزم و كەس و دراوسێكانت سیمای جل لەبەر كردنیان موسڵمانیەتیە ؟ ئەم هەموو درۆ و فرت و فێڵ و زوڵم و ستەمەی كە ئەكرێ ئایا ئەمە

سیفەتی موسڵمانە ئەو بازاڕەی کە ئەچیتە ناوی کە شەرم (ئەکەیت) وللە ی ئەگەر زەرور نەبێت ئێستا ناچین بۆ بازاڕ ئەو ئافرەتانەی کە ئەیبینی ئەو هەموو درۆو قۆڵ بڕینەی کە ئەیبینی لە بازاڕەکانا ئەوە بازاڕی موسڵمانە باشە ئەگەر ئێمە موسڵمانین ئەی بۆچی حەدو شەرعی اللە تعالی نابینی لەسەر زەویا لە وڵاتەکەمان تەتبیق بکرێت اللە تعالی نافەرمووێ عەرەق حەرامە ئەی بۆ بە ئاشکرا ئەفرۆشرێ بۆ بە ئاشکرا ئەخورێتەوە بۆتە شتێکی ئاسای ئەوە وڵاتی مسسڵمانە ؟ ئێمە موسڵمانین ؟ بۆ ئەو کەسەی دزی ئەکات ئەمڕۆ ئەگەر دەسەڵات دار بێت هەر کەس ناتوانی بڵێ پێت لار داناوە ئەوەشی ئاسایە ئەو پەڕی سجن ئەکرێت ئایا لە قورئانا وا باس ئەکرێت قورئان ئەڵێ ئەگەر دز دزی کرد بیکەنە سجنەوە یان دەستی ببڕن ؟ زینا کار ئەو هەموو مەلهە (دیسکۆ)یەی کە کراوەتەوە لەم کوردستانەیا ئایا ئەوە وڵاتی ئیسلامە ؟ ئێمە موسڵمانین ؟ چەن جار خۆت ئەی ئەو کەسەی کە خوێنەر و گوێڕادەگریت بیرئەکەیتەوە ئەڵێی تخوا ئەمە سیفەتی موسڵمانە ؟ ئەمە موسڵمانیەتیە ؟ پرسیار لەلات دروست نەبوو ! ئەمە نیشانەیەکە لەو نیشانە کە ئێمە زۆر دورین لەو ئیسلامەی کە لەو قورئانەیا هاتوە ئایا ئەوە موسڵمانیەتیە ؟ ئێمە ئەزانی لەم سەردەمەیا وەک چیمان لێ هاتووە ئێمە وەک جولەکە و نەسرانیەکانمان لێهاتوە وەک ڕافیزەی شیعە بە خۆشمان ئەڵێین ئەهلی سوننە و موسڵمانین لە قورئان دور کەوتینەوە وایان لێ کردین ئەوانەی بەناو مەلا و مامۆستاوە قسە ئەکەن وایان لێ کردین کە قورئان شتێکە نابێ دەستی لێ بەیت تۆ لێی تێناگەیت تۆ نازانی دەبێ بێیتەوە لای (علماء) دەبێ بێیتە لای زانایان دەبێت لەسەر مامۆستاکان پرسیار بکەیت . وای لێهات وەک تەورات و ئینجیلی لێهات چ فەرقی هەیە تەوارات و ئینجیلیش نە ئەخوێنرایەوە ئەبوایە بچوونایە بۆ لای کەنیسەکان لەلای پاپا و قەشەکان لەوێ پیان بوتنایە لەوێ بۆیان ڕون بکرایەتەوە و لەوێ تۆ بەی بکردایە ئەمڕۆش وامان لێ هاتووە قسەی لەگەڵ ئەکەیت باسی حەقی بۆ ئەکەیت ئەڵێ فڵان مەلا وای ووت فڵان مامۆستا وای ووت قورئان وای لێهاتووە کە شتێکە ئێمە لێی تێناگەین وانییە وللە ی لەحەقیقەتدا وانییە ئێمە هەڵخەڵەتاوین ئەم قورئانە بۆ من و تۆ دابەزیوەتە خوارەوە ئەم قورئانە دانەبەزیوەتە خوارەوە بەس بۆ علماء و مامۆستا و زانایان ئەم قورئانە پەیامێکە گەورە و بچووك لێی تێ ئەگات بەس بچینە سەری و بە دڵ واللە ی لێی تێ ئەگەین قورئان کەتەلۆکێک نییە لوغزی تێدابێت و شتانێکی نهێنی تێدا بێت لێی تێنەگەین ، قورئان بۆ مرۆڤ دابەزیووە بۆ من و تۆ دابەزیووە بەڵام ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ کە بەناوی قورئانەوە قسە ئەکەن ، وایان لە من و تۆ کرد لە ئەسڵی قورئانەکە دورمان بکەنەوە

، دوریان کردینەوە وایان لێمان کرد بۆ ئەوەی هەڵمان بخەڵەتێنن دەست لە قورئان نەدەین بەس بچینە لای ئەوان قسەکانیان لێ وەر بگرین بۆ ئەوەی هەر لەو گومڕای و (ضلال) لەتەیا بمێنینەوە ، ئەی ئێمە هەموو ڕۆژێ لە قورئان لە ناو ئایەتەکەیا کە لە نوێژا ئەڵێین چی﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ ﴾ (الفاتحة: ٦)دوای ئەوە﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧ ﴾ (الفاتحة: ٧) (الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ)جولەکە و یەهودە (الضَّالِّينَ) نەسارِایە ، ئێمە ئەڵێین وەک ئەوانمان لێ نەیەت خوایە ، بەس خۆمان وامان لە خۆمان کردووە ئەوانیش چیان کرد پشتیان لە تەوارات و ئینجیل کرد ، شوێن قەشە و پاپاکانیان کەوتن ئێمەش وامان لێهاتووە کەوتوینەتە دوای مەلاکان پشتمان لەو قورئان کردووە کە ئەو قورئانە الله تعالی وەعدی داوە پاراستویەتی خۆ قسەی مەلاکان پارێزراو نییە بۆیە بەڕێزان با بگەڕێینەوە سەر قورئان باخۆمان قورئان بخوێنینەوە والله ی ڕۆژی قیامەت هیچ عوزرێکمان نییە لای الله تعالی لەبەر ئەوەی ئەوەتا قورئان لە بن دەستماندایە یەك حەرفی نەگۆڕدراوە با بۆ خۆمان بچینەوە سەر ئەو قورئانە بخوێنینەوە نەک لەدەمی فڵانەوە وەر بگرین بەڵێ ئەم زنجیرەیە بەناونیشانی لە تاریکایەکانەوە بەرەو ڕوناکی لە ژێر سایەی ئەم ئایەتەی کە الله تعالی ئەفەرمێت﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٢٥٧ ﴾ (البقرة: ٢٥٧)الله تعالی خۆشەویست و یارمەتی دەری ئەو کەسانەیە کە ئیمانیان هێناوە دەریان ئەکات لە تاریکایەکان بەرەو ڕوناکی سەیری ئەم ئایەتە چەن جوانە ، بەس با لێی تێبگەین بەدڵ (مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ) (ٱلظُّلُمَٰتِ) کۆی زوڵمە تاریکای کۆ (ٱلظُّلُمُ) واتا لە تاریکایەکان (إِلَى ٱلنُّورِ) نور بە تاکی هاتووە بۆ ڕوناکی ؟ واتا ڕێگای تاریکای و گومڕای و فیتنە زۆرە بەڵام ڕێگای حەق یەک ڕێگایە نور (مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ) بەرەو ڕوناکی بۆیە ئەم خەڵکە کە ئەمڕۆ ئەم هەموو پارچە پارچەی و ئەم هەموو حیزب و لایەن و ئەمانەی کە بانگەشەی بۆ ئەکرێت زۆر بەی زۆری (ٱلظُّلُمَٰتِ)تاریکاییە هەموو بەشەکانی زۆری (ٱلظُّلُمَٰتِ) و تاریکای دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ڕوناکی (إِلَى ٱلنُّورِ) بۆ ئەو ڕوناکیەی الله تعالی بەدڵ ! لەبەر ئەوەی گوێ لەم ئایەتە بگرە بیستومانە بەڵام با ئیتر بە دڵ لەگەڵ قورئاندا بژێین با لەو قورئانە تێبگەین بۆ ئێمە دابەزیوە بۆ ئێمەیە با لێی تبگەین الله تعالی ئەفەرمێت﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ٢٤ ﴾ (محمد: ٢٤)ئەزانم بیستوتە ئەم ئایەتە بەڵام بیرت لێکردۆتەوە الله تعالی ئەفەرمێت بۆ بیر ناکەنەوە لەم قورئانە تەدەبوری ناکەن (أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ) یان دڵیان قوفڵی لێدراوە (أَقْفَالُهَآ)واتا ئەم

ئايەتە ئەڵێ دڵ قوفڵی لێ ئەدرێت یانی دڵ قوفڵی لێ ئەدرێ یانی دڵی من و تۆ و ئەی ئەو کەسەی گوێ ڕائەگریت ڕەنگە ئێستا چەنەها قوفڵی پێوە بێت و هەستی پێناکەی ئەمە ئایەتە گومانی تیا نییە بەس ئێمە لێی تێنەگەیشتووین یانی ئەو شتەی کە کاتێک کەسێک ئەکەوێتە گومڕایەکەوە ئەکەوێتە کوفر و شیرک و ضلال)ەتەوە ئەوە قوفڵ لە دڵی دراوە ئەو بەشەی دین تێنەگەیشتوە لەبەر ئەوەی خۆی وای لە خۆی کردوە بۆیە بە ئیزنی الله تعالی لەم زنجیرەیەدا چەنەها قوفڵ هەیە لەسەر دڵەکانمان دەبێت بیکەینەوە بە ئیزنی الله تعالی دوعا ئەکەین کە یارەبی ئەو قوفڵانەی سەر دڵمان بکەوە والله ی لە گومڕای ئەژیان کاتێک الله تعالی ئەو قوفڵانەی سەر دڵمانی لابرد ئەوجا زانیمان حەق کامەیە و باتڵیش لە کامەیە بۆیە ئەی ئەو کەسەی کە گوێ ئەگریت بە دڵەوە بژێ وا گوێ ڕامەگرە کە وا بزانی تۆ حەقت پێیە کە تۆ لەسەر حەقی تۆ هەموو شتێکت زانیوە خۆشت ئەزانی کە هەموو شتێک نازانیت بەڵام با ئەو فکرە لابەین با بێین بگەڕێین لە کوێوە قوفڵ لە دڵمان دراوە ئەو قوفڵانە بکەینەوە بۆ ئەوەی دەست بەو حەقەوە بگرین ڕێگا ڕاستەکە بگرین یەکێ لەو شتانەی کە خەڵک زۆربەی زۆریشمان ئەو گلەیە ئەکەین ئەڵێین مەلاکان و مامۆستاکان حەق ناڵێن ڕاستیەکان ناڵێن ناوی کەسەکان یەک یەک ناڵێن ڕوونی ناکەنەوە بۆ خەڵک بۆیە ئێمە لەم زنجیرەیەدا بە ئیزنی الله تعالی ئەو حەقەی کە الله تعالی ئەمری پێکردووە ڕوون بکرێتەوە هەمووی ڕوون ئەکەینەوە ناوی لایەنکان و حیزبەکان و کەسەکان تاک تاک ناویان ئەهێنین بۆیە ئەو کەسەی وا ئەڵێ بۆ ئەوەی حوجەی نەبێ بۆ ئەوەی نەڵێ حەقم بۆ ڕوون نەکراوەتەوە لە هیچ سەردەم و هیچ کاتێکدا کەس نەبوو بۆمان ڕوون بکاتەوە یەک یەک ناوی کەسەکان دێنین یەک بە یەك ناوی ئەو جەماعەتانە دێنین کە لەسەر حەقن وە ئەوانەشی کە لەسەر باتڵن بۆ ئەوەی بزانی کامە حەقە و کامە باتڵە بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە بۆت ، بەڕوونی لەبەر ئەوەی الله تعالی لە قورئاندا ئەو قورئانەی کە ئێمە لێی تێناگەین بەداخەوە لەبەر ئەوەی لێی دور کەوتینەتەوە ئەفەرمێت ئەو ئایەتانەی کە بۆ ئێمە لە قورئاندا هاتووە هەمووی بۆ ئێمەیە کە باسی یەهود و نەساڕاش ئەکات باسی ئاگر پەرستان ئەکات و باسی هەر لایەنێک ئەکات بۆ ئەوەی ئێمە لێی تێبگەین سوود و عیبرەتی لێ وەر بگرین نەک بەس بۆ کەوا گووێی لێ ڕابگرین و وابزانین کە وا بەس بۆ ئەوان دابەزیووە ، زۆر بەداخەوە زۆربەی کات ئێمە وا قورئانمان ئەخوێندەوە کە باسی جولەکە و نەسڕانی و غەیری ئیسلامیەکانی کرد ئەوانەی کەوا موسڵمان نین وامان ئەزانێ بەس بۆ ئەوان دابەزیووە کە ئەوان وایان کرد و وایان کرد بەڵام لە حەقیقەتدا بۆ ئێمە

دابەزیووە لەبەر ئەوەی ئێمەش ئەوەمان بەسەر دێت بۆ ئەوەی لێی تێبگەین و کە کاتێک کەوتینە ناویەوە لێی تێبگەین الله تعالی ئەفەرمێت لە قورئاندا لەسورەتی ال عمران ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ١٨٧﴾ (آل عمران: ١٨٧) الله تعالی پەیمانی وەرگرت لەوانەی کە خاوەن کیتابن (لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ) دەبێ ڕوونی بکەنەوە بۆ ئەو خەڵکە نەی شارنەوە حەقەکە هەمووی بۆ خەڵک ڕوون بکەنەوە نابێ ئەو خەڵکە لە گومڕایدا بژێ ناوی ئەو کەسانە بێنە کە گومڕان وەک الله تعالی لە قورئاندا ئەفەرمێت ئەبو جەهل و سامیری و فیرعەون دەبێ یەک یەک ئەو تاغوت و ئەوانە کە کافر و بێدینن ناویان بهێنرێ بۆ ئەوەی خەڵک ڕونبێتەوە بەڵام بەداخەوە خۆشتان چاک ئەزان کە ئەوانەی سەر مینبەر جگە لەوانەی کە الله ڕەحمی پێکردوون ، حەقەکە بۆ خەڵک ڕوون ناکەنەوە ڕاستیەکان ناڵێن خۆشتان چاک ئەزان لە لای خەڵکیشدا ئەڵێ ئەترسێ ئەی گرن وای لێ ئەکەن ، ئەوە حەق نییە حەق دەبێ بووترێ بە تایبەت ئەو کەسانەی کەچونەتە سەر مینبەر کە ئەڵێن ئێمە جێنشینی پێغەمبەرین کە ڕاست ناکەن زۆر بەی زۆریان درۆئەکەن حەقەکەیان شاردۆتەوە بۆ لەبەر پاریەک و شتێکی دونیای هیچ لەبەر مەنسب و لەبەر ڕاتب و لەبەر پارە دین و ئیمانیان فرۆش بەداخەوە بۆیە بە ئیزنی الله تعالی ئەو قورئانە بەو شێوەی کەوا الله تعالی ئەمری پێمان کردووە ڕوونی ئەکەینەوە لەم زنجیرەیەدا بۆیە ئەو کەسی کە گوێ ئەگرێت تکات لێ ئەکەم والله ی سوێند بە الله تعالی هیچ مەسڵەحەتێکم نییە کە ئەم قسانە ئەکەم لە دونیایدا نە من پێویستم بە تۆیە کە گوێ ڕاگریت نە تۆ پێویست بە منە تەنها مەبەستم ئەوەیە تکات لێ ئەکم بە دڵ لە گەڵیابە والله ی سوودی لێ وەر ئەگریت بە ئیزنی الله تعالی لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو گومڕایەمان بینی کە لە ناوی بووین لەو تاریکایەدا تکات لێ ئەکەم سوودی لێوەرگرە ئەم قسانە بە دڵ لەگەڵیدا بە کاتی بۆ دابنێ لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆربەی خەڵک وایە گوێ لە باسی دین ناگرێت هەتا بتوانێت ئیش ئەکات دەوام ئەکات ماڵی هەموو شتێک ئەباتە ڕێوە دوایی لە کۆتا کاتی مایەوە ئەگەر تۆزێ گوێ ڕابگرێ والله ی ئەوە نییە کە الله تعالی ئەمری پێمان کردووە دەبێ دین و ئیمانەکەت بکەیتە پێش هەموو شتێکەوە پاشان شتەکانی دیکە ئەگەر کات مایەوە ئەوانی تر بکەیت نەک دینمان کردۆتە دوای هەموو شتێکەوە بۆیە تکات لێ ئەکەم با بە دڵ لەگەڵ ئەمەدا بین وا هەست بکەین حەقێک هەیە بزرە دەبێ بدۆزرێتەوە دوعای زۆر بکەین کە الله تعالی ئەو ڕێگا ڕاستەمان بۆ ڕوون بکاتەوە دەستی پێوە بگرین لە بەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)ئەفەرمێت ئەوەی

الله تعالی دای ناوه بۆ به‌نده‌كانی زۆر شتێكی گران و گه‌وریه ئه‌وه‌ی الله تعالی دایناوه جه‌نه‌ته به‌هه‌شته بۆیه ئه‌و به‌هه‌شته‌ی كه ئه‌مانه‌وێت هه‌روا به ئاسانی به‌ده‌ست نایه له دونیا ئه‌و هه‌موو هه‌وڵه ئه‌ده‌ین بۆ چه‌ند پاره‌یه‌ک و بۆ مه‌نسه‌بێک و شتێكی دونیای هیچ كه وا له‌گه‌ڵ مردنمان هه‌موو كۆتای یه‌ت ده‌بێ ده‌قات به‌قه‌د ئه‌وه هه‌وڵ بده‌ین بۆ دین و ئیمانه‌كه‌مان كه لێی تێبگه‌ین كه ئێمه بۆچی دروست كراوین مه‌به‌ست له دروست كردنی ئێمه چییه له‌م دونیایه هاتونه‌ته سه‌ر ئه‌م زه‌ویه ئێمه بۆ عیباده‌ت دروست كراوین به‌ڵام چ عیباده‌تێک ئه‌وه‌ی كه قورئان و فه‌رمووده باسی كردووه نه‌ک ئه‌وه‌ی مه‌لا له‌سه‌ر مینبه‌ر بۆمانی باس كردووه كه والله ی زۆربه‌ی زۆربه‌ی خه‌ڵک گومڕا بووه به هۆی ئه‌و مه‌لا و مامۆستایانه‌وه كه به‌ناوی دینه‌وه قسه ئه‌كه‌ن كه زۆربه‌شتان خۆشتان ئه‌زان زۆر به‌ی زۆریان گومڕان و له‌به‌ر پاره و ترس زۆر شتیان شاردۆته‌وه له‌و خه‌ڵكه بۆیه با به دڵ كاتێكی باش دابنێن بۆ ئه‌م زنجیره‌یه تا بتوانین سوودی لێ وه‌ربگرین به ئیزنی الله تعالی دوعای زۆر بكه‌ین كه هیدایه‌تمان بدات و بمان كاته سه‌ر ئه‌و (الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ)ه‌ی كه خۆی دایناوه بۆ به‌نده‌كانی أللهم أمين بۆیه له‌سه‌ره‌تادا له‌م بابه‌ته‌دا پێویسته پێشه‌كیه‌كی كورت باس بكه‌ین دوای ئه‌چینه ناو بابه‌ته‌كانه‌وه به ئیزنی الله تعالی به‌ڵێ به‌ڕێزان ئێمه له‌سه‌رده‌می فیتنه‌دا ئه‌ژین زه‌مانی فیتنه‌یه به‌ڕاستی واتا زۆربه‌ی خه‌ڵكی خۆتان گوێتان لێ ئه‌بێت ئه‌ڵێن ئاخیر زه‌مانه فیتنه زۆر بووه شت زۆر بووه ڕاسته ئه‌م قسه‌یه ئێمه له ناویدا ئه‌ژێین به‌ڵام ئه‌وه‌ی مشكیله‌كه‌یه ئه‌وه‌یه كه ئه‌و كه‌سه‌ی ئه‌ڵێ ئاخر زه‌مانه فیتنه زۆره گۆمڕای زۆره خۆی كه‌وتۆته ناوی به‌س هه‌ستی پێ ناكات وا ئه‌زانی ده‌ورو به‌ره‌كه‌ی گومڕا بوون به‌ڵام ئه‌و ته‌واو له‌سه‌ر حه‌قه‌كه‌یه ئه‌و موشكیله‌كه‌یه كاتێک كه خۆمان هه‌ست به‌وه نه‌كه‌ین كه له ناو فیتنه‌كه‌دا بین هه‌ستی پێ نه‌كه‌ین با گووێ له‌م حه‌دیسه بگرین بزانه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) چه‌ن به جوانی باسی ئه‌م كاته‌مان بۆ ئه‌كات ولله ی ئه‌و ئایه‌تانه و ئه‌و فه‌رموودانه كاتێک كه به دڵ ئه‌خوێنیته‌وه و به دڵ تێ ئه‌گه‌یت لێی وا ئه‌زانی ئێستا دابه‌زیوه‌ته خواره‌وه ئێستا له‌گه‌ڵ ئێمه‌دا قسه ئه‌كات وا ئه‌زانی ئێستا دابه‌زیوه‌ته خواره‌وه رسول ألله (ﷺ) ئه‌فه‌روێت ساڵانێكی هه‌ڵخه‌ڵه‌تێنه‌ر دێت به‌سه‌ر خه‌ڵكیدا واتا خه‌ڵكێكی زۆر هه‌ڵ ئه‌خه‌ڵه تێنرێ له‌و سه‌رده‌مه‌دا ئه‌وه‌ی درۆزنه به ڕاستگۆ له قه‌ڵه‌می ئه‌یه‌ن ئه‌ڵێن ئه‌م ڕاستگۆیه به‌رزی ئه‌كه‌نه‌وه له ته‌له‌فیزیۆن ده‌ری ئه‌خه‌ن و ئیعلانی بۆ ئه‌كه‌ن ئه‌مه كه‌سه باشه‌كان مافتان بۆ ئه‌گێڕنێته‌وه واو و وا ئه‌وه‌شی ڕاستگۆیه ئه‌ڵێن درۆزنه فێڵ بازه خراپه خزمه‌تی میله‌ت ناكات ئه‌مانه قه‌ومی خۆیان ناوێ ئه‌مانه وان

ئه‌مانه وان ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر ڕاستیه‌كه‌یه هه‌زار ته‌عنی لیٚ ئه‌دریٚت ئه‌وه‌شی ئه‌مین ده‌ست پاكه به خائین به‌دروٚزن و به خراپه له قه‌ڵه‌م ئه‌دریٚ به‌ڵام ئه‌وه‌ی كه وا خراپه ده‌ست پیسه دزه هه‌رچی شت هه‌یه پاره بوٚ خوٚی ئه‌بات بوٚ خوٚی و بنه‌ماڵه‌كه‌ی و سه‌رفی ئه‌كات ئه‌ڵیٚن ئه‌وه باشه ئه‌وه وایه مه‌تح ئه‌كریٚت و به‌رز ئه‌كریٚته‌وه ده‌نگی پیٚ ئه‌دریٚ خزمه‌ت ئه‌كریٚت له پاشان ئه‌فه‌رمیٚ كه‌سیٚكی هیچ و پوچ به ناوی خه‌ڵكه‌وه قسه ئه‌كات بوٚ خه‌ڵك كار و باری خه‌ڵك ئه‌باته ڕیٚوه فه‌توا ئه‌یات و قسه ئه‌كات ئه‌ڵیٚ ئه‌مه ڕیٚگای ڕاسته و ئه‌مه حه‌قه و ئه‌مه باتڵه كه‌سیٚكه خوٚی هیچ و پوچه مافی به‌دینه‌وه نییه ئه‌سڵه‌ن له دینیش تیٚ نه‌گه‌یشتووه ئایا ئیٚمه ئیٚستا له ناو ئه‌و واقیعه‌دا ئه‌ژین یان نا به‌چاو خوٚمان ئه‌م شتانه ئه‌بینین یان نا ئه‌مڕوٚ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه وا ڕست گوٚن هه‌زار ته‌عنیان لیٚ ئه‌دریٚ به‌ڵام ئه‌وه‌ی دروٚزن و ده‌ست پیس و چه‌په‌ڵه و زاڵم و سته‌م كاره ئه‌مڕوٚ به‌رز كراوه‌ته‌وه و له ته‌له‌فیزیوٚنه‌كان ئیعلانی بوٚ ئه‌كریٚت و به كه‌سیٚكی زوٚ ڕاست گوٚ و باش له قه‌ڵه‌م دراوه به‌داخه‌وه ئه‌وه بوٚیه بزانه ئیٚمه له‌م سه‌رده‌مه‌دا ئه‌ژین وه له فه‌رمووده‌یه‌كی تردا ئه‌فه‌رمیٚت (ﷺ) ڕاكه‌ن په‌له بكه‌ن كرده‌وه‌ی چاكه بكه‌ن پیٚش ئه‌وه‌ی فیتنه‌ی وا به‌سرتاندا بباریٚت وه‌ك شه‌وی تاریك پارچه شه‌وی تاریك چوٚنه ئاوها به‌سه‌رتاندا بباریٚت ولله ی وایه ولله ی ئه‌وه‌ی كه ئیمان له دڵیا بیٚت له ته‌وحید تیٚگه‌یشتبیٚ له لا اله إلا أﷲ تیٚگه‌یشتبیٚ ئه‌م دونیایه وا تاریك بووه ئیلا چه‌ن شویٚنیٚك نه‌بیٚت جگه له‌وه‌ی كه اﷲ ڕه‌حمی پیٚكردوه وه له دوای ئه‌وه ئه‌فه‌رمیٚت چی ئه‌فه‌رمیٚت به‌یانی كه‌سه‌كه موسڵمانه ئه‌و پیاوه ئیٚواره‌ی به‌سه‌رادایه‌ت كافر بووه یان جاری وا هه‌یه ئیٚواره موسڵمانه به‌یانی هه‌ڵ ئه‌سیٚت سه‌یر ئه‌كات كافر بووه هه‌موو دین و ئیمانی ئه‌فروٚشیٚت به شتیٚكی هیچ و پوچی دونیا به‌داخه‌وه ئه‌مڕوٚ واﷲ ی ئاوا ئه‌ی بینین واﷲ ی چه‌نه‌ها كه‌س هه‌یه به‌یانی موسڵمانه ئیٚواره‌ی به‌سه‌ردا دیٚت كافر بووه به‌ڵام ئه‌و كه‌سه ئه‌یبینیٚ كه به قورئان سه‌یری شته‌كان ئه‌كات به فه‌رمووده نه‌ك به قسه‌ی زانایان و كه به زانا ناسراون ئه‌مڕوٚ ئه‌گه‌ر له‌و واقعه له‌و ته‌وحیده تیٚبگه‌یت و اﷲ ی ئه‌م فه‌رمووده‌یه ئه‌بینی به چاوی خوٚت بوٚیه له فه‌رمووده‌یه‌كی دیكه‌دا باسی بكه‌ین رسول اﷲ (ﷺ) چی ئه‌فه‌رمیٚت ئه‌م فه‌رمووده‌یه با به دڵ له‌گه‌ڵیا بین بزانین چوٚن باسی ئه‌م واقیعه ئه‌كات پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ)ئه‌فه‌رمیٚت فیتنه ئه‌دریٚ به‌سه‌ر دڵا ، فیتنه ئه‌ونده زوٚر ئه‌بیٚ به‌سه‌ر خه‌ڵكدا ئه‌ڕوات وه‌ك حه‌سیر ، حه‌سیرتان بینیوه حه‌سه‌یر ئه‌بینین چنراوه تیٚكه‌ڵی یه‌ك كراوه هه‌ر یه‌كه‌یان ئه‌كه‌یت به‌ناو یه‌كدا ئه‌م به‌سه‌ر ئه‌وا یه‌كی گرتووه و به قوه‌ت بووه ئه‌فه‌رمیٚت فیتنه جاریٚ دیٚ دانه‌یه دیٚ دانه دیٚ تا وای لیٚ دیٚت

سه‌ر ئه‌و دڵه ئه‌گرێت ئه‌و دڵه دا ئه‌پۆشێت هه‌ر دڵێک بیخواته‌وه نوقته‌یه‌کی ڕه‌ش له‌سه‌ر دڵی ئه‌درێ هه‌ر دڵێکیش ئینکاری بکات که بزانێ ئه‌مه کوفره بێدینیه زوڵم و سته‌مه نوقته‌یه‌کی سپی له‌سه‌ر ئه‌و دڵه ئه‌درێ تا وای لێ دێت هه‌موو مرۆڤی سه‌ر زه‌وی ئه‌بێ به دوو دڵ هه‌ندێکیان له‌و دڵه‌ن هه‌ندێکیان له‌و دڵه‌ن دڵێکی پاکی سپی ڕوون هیچ فیتنه‌یه‌ک ته ئسیری لێ ناکات ئه‌و که‌سه هه‌تا ئه‌رز و ئاسمان مابێت وای لێ دێت ئه‌و دڵه‌ی ئه‌وه‌نده پاک و سپی و ڕوون ئه‌بێت ئه‌وه‌ی تریش ڕه‌ش هه‌ڵ ئه‌گه‌ڕێت وه‌ک شتێکی ڕه‌ش که پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) باسی ئه‌کات نه ئه‌زانێ مه‌عروف و چاکه و ڕاست گۆی چییه ، وه له مونکه‌ریش تێناگات و ناتوانێ ئینکاری لێ بکات که ناحه‌ق و باتڵه واتا هه‌وه‌س و هه‌وای خۆی و حه‌زی له هه‌رچی بێت ئه‌وه ئه‌کات وﷲ ی ئه‌م فه‌رمووده‌یه زۆر به ڕوونی دیاره ئه‌مڕۆ بۆته دوو به‌شه‌وه به‌شێکیان له‌سه‌ر حه‌ق به‌شێکیان له‌سه‌ر باتڵ ئه‌مڕۆ کوفر و ئیمان جیا بۆته‌وه ئه‌وه‌ی به نوری الله تعالی ببینێت ! ئه‌بینێ که ئه‌هلی کوفر له کوێن و ئه‌هلی ئیمانیش له کوێن بۆیه ئێمه له ناو ئه‌و واقیعه‌دا ئه‌ژیین باشه چۆن نه‌جاتمان بێت له‌م حاڵه‌ی که ئه‌مڕۆ تێیکه‌وتووین ته‌نها یه‌ک ڕێگا هه‌یه که ئه‌مه کۆتایه‌که‌یته‌ی باسی ئه‌که‌ین له‌م زنجیره‌یه‌دا ته‌نها یه‌ک ڕێگا هه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی نه‌جاتمان بێت له‌م ڕۆژه‌ی که له ناوین که پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌فه‌رمێت شته‌کان تێکه‌ڵ ئه‌بێت و تێک هه‌ڵ ئه‌چێت وای لێ دێت شته‌کان له خه‌ڵک بزر ئه‌بێت له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خه‌ڵکه‌که خۆی خرپه نه‌ک شته‌که بزره که وای لێدێت دڵ ره‌ش ئه‌بێت که ڕه‌ش بوو ئیتر حه‌قه‌که‌ی لێ وون ئه‌بێت ، خۆی وونی کردووه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خۆی ئاگادار نه‌بوو ئه‌م هه‌موو فتنه‌یه‌ی که له دڵی ئه‌و نوقته ڕه‌شه‌ی که دڵی ڕه‌ش کردووه ئا لێره‌دا که ئه‌ڵێن حه‌ق بزر بووه ، حه‌ق بزر نه‌بووه حه‌ق ڕوون بووه به‌ڵام ئێمه و تۆ که ئینکاریان له‌م مونکرانه و له‌م هه‌موو کوفر و بێدینیه‌مان نه‌کرد و لێی تێنه‌گه‌یشتین و دژی نه‌وه‌ستایته‌وه وامان لێ هات ، ئه‌و هه‌موو نوقته ڕه‌شه له دڵتی دا وای لێ هات حه‌قه‌که‌ت له‌لا تاریک بوو ئیتر بزرو بوو له لات باشه چۆن نه‌جاتمان بێت؟؟ چۆن بگه‌ڕێنه‌وه سه‌ر ئه‌و حه‌قه ته‌نها یه‌ک ڕێگا هه‌یه که ئه‌ویش ئه‌فه‌رمێت (ﷺ) له فه‌رمووده‌یه‌کدا دووشتم له ناوتاندا به جێ هێشتووه ئه‌گه‌ر ده‌ستی پێوه بگرن به‌هیچ جۆرێک گومڕا نابن به‌رده‌وام حه‌قتان لێوه دیاره و ده‌ستی پێوه ئه‌گرن ئه‌ویش قورئانه‌که‌ی الله تعالی و سونه‌ته‌که‌ی پێغه‌مبه‌ره‌که‌یه‌تی علیه الصلاة والسلام که له فه‌رمووده سه‌حیحه‌کانه بۆیه پێویسته بڕۆینه سه‌ر قورئان و سونه‌ت خۆمان بیخوێنینه‌وه لێی تێبگه‌ین ته‌بعه‌ن که ئه‌ڵێن با خۆمان بیخوێنینه‌وه ئه‌وه نییه که ئه‌ڵێن ئێمه حساب بۆ زانایان نه‌که‌ین نا ئه‌وانه‌ی که له‌م

سەردەمەیدا ئەژین بە ناو زانا زۆربەی زۆری گومڕایە پێویستە بگەڕێنەوە سەر زانایانی کۆن وەک ئیمامی مالیک و ئیمام شافیعی و ئیمام ئەحمەد و ئەو ئیمامە بەڕێزانەی کە وا لەسەردەمی کۆندا هاتن ڕەحمەتی الله تعالی یان لێبێت پێویستە بگەڕێینەوە سەر ئەوان لە فەهمی ئەوانەوە لە شتەکان تێبگەین ئەگەر لە شتێک تێنەگەیشتین ئەوەی لێی تێگەیشتین ڕوون وئاشکرایە پێووستی بە قسەی ئەم و ئەو نییە ئیلا لەسەر ئەوانەی کە پێویستە قسەی لەسەر بکرێت ڕوون کردنەوەی تێدا بکرێت ئالە و کاتەیدا ئەگەڕێنەوە سەر قسەی ئەو زانا کۆنانە پێشینانی سەلەف رحمهم الله بۆیە بە ئیزنی الله تعالی لە زنجیرەی داهاتوو ئەچینە سەر باسکان

دانە دانە ڕوونی ئەکەینەوە کە بزانین چۆن نەجاتمان ئەبێت دەست بەو قورئانەوە بگرین پێویستە لەگەڵیدا بین لەبەر ئەوەی باسی کوفر و ئیمانە دەبێت بزانیت ئیمان چیە و کوفر چییە نەک ئەوەی خەڵک عام لێی تێگەیشتووە عامی خەڵک زۆر بە خەڵەت لە دین تێگەیشتووە بۆیە دوعا زۆر بکەین یەکێ لەو خاڵانەی کە دەستی پێوە بگرین زۆر دوعا بکەین کە بڵێین یارەبی هیدایەتمان بدە بۆ ڕێگا ڕاستەکەی خۆت ئەم دوعایە زۆر بەکەین کە الله تعالیٰ حەقمان نیشان بدات و دەستی پێوە بگرین باتڵیشمان بۆ ڕوون بکاتەوە بۆ ئەوەی لێی دور بکەوینەوە دوعا زۆر بکەین و بەردەوام بین لە خوێندنی حەق و گوێ گرتنی حەق تا بتوانین بێنە سەر ئەو ڕێیە ڕاستە بە ئیزنی الله تعالی

